# پەروەردە و
# شێوازەکانی

چاپی یەکەم

نوسینی

محمدی رازی

١٩٩٦_١٤١٧

# پەروەردە و شێوازەکانی

چاپی یەکەم

نوسینی

**محمدی رازی**

١٤١٧_١٩٩٦

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشکەشە بە:

گیانی بەرزەفڕی هەرسێ موجاهیدی شەهید :

**(مەلا حمە امینی ولاّخلو.. عبدالباسطی ماموٚستای بانی شار.. صاڵحی رازی)..**

# پێشەکی

*[یاایها الذین امنوا قو انفسکم واهلیکم نارا وقودها الناس والحجارة]*

*[وان هذا صراطي مستقیما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن سبیله ذلکم وصیکم به لعلکم تتقون]* الانعام/١٥٣.

پەروەردە بەردی بناغەی کۆمەڵەو ڕێبازی پەروەردەیش دەستووری یاسایەکە کەسوودو بەرژەوەندی کۆمەڵ و زیان و لێک پچڕانی کۆمەڵی لەسەر وەستاوە.. واتە پەروەردەی چاك و بەجێ سەربەرزی و سەرفرازی هەمیشەیی بۆ کۆمەڵ دابین دەکات، هەروەکو پەروەردەی خراپ و بێ جێ کۆمەڵ بەرەو هەڵدێری فەوتان ولێك پچڕانی شیرازەو زەبوونی و کۆیلەیی دەبات.. هەر بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش پتر لەهەر کۆمەڵ و ڕێبازێك بایەخی بەپەروەردە داوەو بەشی هەرەزۆری قورئانیش بۆ ئەم مەبەستە هاتووەو لەپەروەردە دەدوێت.

چونکە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەو ئاکام (نتیجە)یە گەیشتووەو پێی وایە کەژیانی ئادەمیزاد هیچ کات ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ پیادە ناکرێت، تاکو کۆمەڵی ئادەمیزاد پەروەردە نەکرێت و بارنەیەت، وەکۆمەڵی ئادەمیزادیش وەکو (تجربة) نیشانی دان بەگەشەو پێشکەوتنی لایەنی ماددی، وەیان زۆر بوون و لەراهەم هێنانی کەرەستەی ژیان، وەیان بەرز بوونەوەی ڕادەی بیری ئابووری و رامیاری، وەیان زیاد کردن و بەرز بوونەوەی ڕادەی زانیاری مرۆڤ و تەنانەت گەشت کردنیان بەرەو مانگ و باقی ئەستێرەکان، ئەمانەو دەیان شتی تر نەیانتوانی ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد دابین بکەن.. وەدیاردەی خۆکوشتن و سەرگەردانی لەکۆمەڵگای وڵاتە پێشکەوتووەکاندا زیاترە لەوڵاتە کەم دەست و دواکەوتووەکان لەم سەردەمەداو ئەم ڕاستییەشمان بۆ دەردەخات.. کەواتە مایەی بەختەوەریی کۆمەڵ پەروەردەی چاك و بەجێیە.. وەکۆمەڵیش ناگاتە ئاستێکی بەرز لەپەروەردەدا تاکو یەکە بەیەکەی کۆمەڵ پەروەردە نەکرێت. لای دۆست و دوژمن روون و ئاشکرایە کەنەهیچ کام لەئایینە دروستکراوو دەست تێخراوەکانی وەکو گاورو جولەکەو بودایی و گاپەرستی و بت پەرستی وەنەحیزب و ڕێبازە دەستکردەکانی وەکو مارکسی و سۆسیالیستی و دیموکرات نەیانتوانی ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ

کۆمەڵ دابین بکەن.. چونکە دەرمانی دەردی کۆمەڵیان پێ نەبوو.. وە داخوازی یەکانی دەروونی یەکەیەکەی کۆمەڵیان لانەبوو.

کەواتە تەنها ئیسلامە دەتوانێت ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد دابین و مسۆگەر بکات، ئەویش لەرێی پەروەردە کردنی کۆمەڵەوە.. چونکە ئیسلام داخوازیەکانی دەروونی ئادەمیزادی پێیەو دەشزانێ دەردی کۆمەڵ چی یە کەبریتی یە لەبێ باوەڕی و بەسوک و کەم تەماشاکردنی نرخ و رێزی ئادەمیزاد، وەباشترین و شیاوترین جۆری پەروەردەی پێیە بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد.

بەڵام پێی وایە تادەروونی یەکەیەکەی کۆمەڵ لەبێ باوەڕی و کەچ رەوی و بیرنزمی پاک و خاوێن نەکرێتەوە، وەلەسەر خواناسی و یەکتاپەرستی و راست رەوی و دانەمەزرێ و پەروەردە نەبێت کۆمەڵیش پەروەردە نابێت و ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ کۆمەڵ ناگەرێتەوە.. هەربۆیە ئیسلام لەیەکەم هەنگاوی پەروەردەیدا بەچەسپاندنی ئیمان لەدڵ و دەروونی ئادەمیزاددا دەست پێ دەکات و پەروەردەی دەروونی (نفسي) و گیانی (روحي) دەخاتە پێش هەر جۆرە پەروەردەیەکی ترەوە.. وەبەم فەرموودە قورئانی یە رێبازی خۆی روون دەکاتەوەو هەموو لایەکی بۆ بانگ دەکات و (خطي بطلان) بەسەر باقی رێگەو رێچکەکاندا دەکێشێ و ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەو رێچکانە کۆمەڵ پەرتەوازەو لەیەکیان جوێ دەکاتەوەو مەینەتی و زەبوونی و ناثارامی لەناو کۆمەڵدا بەرپا دەکات.. ئەمەش ئەو فەرموودە پیرۆزەیە: ***[وان هذا صراطي مستقيما فآتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصيكم به لعلكم تتقون]*** الانعام/١٥٣.

جا ئێمەش بەیاریدەی خوای گەورە لەم نامیلکەیەدا کۆشەیەک لەجۆرو شێوازی پەروەردە بۆ خوێنەران روون دەکەینەوە لەسێ بەشداو چۆنیەتی پەروەردە بەیان دەکەین:

**بەشی یەکەم : لەکوێوە دەست پێ بکەین؟**

**بەشی دووهەم : جۆرو شێوازەکانی پەروەردە.**

**بەشی سێهەم : لەسەر چی پەروەردە بکەین؟**

بەهیوای ئەوەی کەجێگەی رەزامەندی خوای گەورەو سوودمەندی خوێنەران بێت.

# لەکوێوە بە پەروەردە دەست پێ بکەین؟

هەروەکو لە پێشەکی یەکەدا زانیمان کەئاسایش و ئاسوودەیی ناگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵ بەگۆڕانی بنچینەی کۆمەڵ نەبێت.. وەهیچ هیوایەك بەژیانەوەی ئیسلام و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و پیادەکردنی یاساکانی ئیسلام نی یە جگە بەگۆڕاندنی ئەم کۆمەڵەی ئەمڕۆ نەبێت، وەکۆمەڵیش ناگۆڕێت بەپەروەردەکردنی نەبێت.

جابەر لەوەی باسی ئەوە بکەین کەلەکوێوە دەست بەپەروەردە بکەین، پێویستە تایبەتمەندی یەکانی پەروەردەی ئیسلامی بزانین، ئەویش پەروەردەیەکی ئیسلامی کەهەدەف و ئامانجی گۆڕانی کۆمەڵ و دامەزراندنی دەوڵەت و حاکمیەتی ئیسلام بێت، ـ **لایەنێك لەلایەنەکانی ژیان ناگرێ و باقی لایەنەکانی تری بەرەلا بکات** ـ... بۆ نمونە نابێ هەموو هەوڵ و تێکۆشانی پەروەردەی ئێمە تایبەت بکرێت بەلایەنی ڕۆحی و ئەخلاقی، وەکو (تصوف و ئەهلی طريقة) کەتەنها ئەو لایەنەیان گرتووە... وەنابێ هەوڵ و تێکۆشانی ئێمە لەپەروەردەدا تەنها لایەنی فکری و بیروبۆچوون بگرێ، وەکو (فلاسفة وعلماي كلام) کەهەر بەو لایەنەوە خەریك بوون.. وەنابێ هەموو هەوڵی پەروەردەیمان تەنها لەبواری سەربازی و مەشق کردنی سەربازانی ئیسلامدا بێت.. وەنابێ چالاکی پەروەردەیمان لەناو کۆمەڵدا وەکو ئیصلاحی و کۆمەڵ شناسین بێت..بەڵکو دەبێت پەروەردەی ئیسلامی تەواو و ڕەسەن و بۆ هەموو مرۆڤایەتی (بشرية) بێت، وەتەواوی لایەنەکانی مرۆڤ بگرێتەوە، وەپەروەردەیەکی (شامل)و هەمە لایەنە بێت بۆ عەقڵ و دڵ و ڕوح و بەدەن و ڕەوشت و ئاکاری..هتد، بەجۆرێکی واکە ئەو مرۆڤە ئامادە بکرێت بۆ ژیان بەخۆشی و ناخۆشی ی، بەشەڕو ئاشتی ی، بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی لەگەڵ گشت ئازارو ئەشکەنجەیەك کەدێنە ڕێگای.

کەوانە لەکاتێکدا پەروەردەی (جیهادی) دەکرێت، پێویستە

پەروەردەی کۆمەڵایەتیش بکرێت هەتا موسڵمانان لەشێوێکدا نەژین و ئەو کۆمەڵەی دەورو بەریشی لەشێوێکی تردا.

پاش ئەوەی کە هەمەلایەنی پەروەردەمان زانی، بابگەڕێینەوە سەر باسەکەمان کەئەویش ئەوەیە ـ لەکوێوە دەست پێ بکەین؟ـ.. ئەگەر چاوێ بەمێژووی ئیسلامدا بگێڕین کەپێشەوا (مربي) یەکەممان حەزرەتی محمد (ﷺ) لەماوەی سیانزە ساڵی مەککەدا پەروەردەی کرد، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لەپەروەردەی دەروونی یەکەیەکەی کۆمەڵەوە دەست پێ بکەین و چرای ئیمان و یەکتاپەرستی لەدەروونەکاندا دابگیرسێنین و لەبێ باوەڕی و هاوەڵ بۆ خوا دانان و مرۆڤ بەکەم زانین و گشت ژەنگ و ژارێکی تر دەروونیان پاك بکەینەوە.

خوای کار بەجێش دەفەرموێت *[ان الله لايغير مابقوم حتى يغيروا مابأنفسهم]*(١)، وەدەبێ پەروەردەی دەروونی خۆمان بخەینە پێش پەروەردەی دەروونی خەڵکی.. ـ اصلح نفسك ثم ادعو غيرك ـ.. جامادام ئەوەمان زانی کەسەرەتای دەست پێ‌کردنی پەروەردەمان لەنەفس و دەروونەوەیە، وەدەرمانەکەشی باوەڕی خوایی و یەکتاپەرستی یە، ئەوێ پێویستە مرۆڤەکان و نەخۆشی یەکانی دەروونیان بناسین و دەست نیشانی دەردەکانیان بکەین، ئەگەر نا لەچارەسەرو پەروەردەکردنیاندا بەهەڵەدا دەچین و دەردەکە گرانتر دەبێت.

ئاشکرایە کەپەروەردەکردنی (مرۆڤێکی وجودي) جودایە لەگەڵ پەروەردەکردنی (مرۆڤێکی شیوعی)دا.. هەروەکو پەروەردەکردنی ئەو دووانە جیاوازە لەگەڵ پەروەردەکردنی (مرۆڤێکی بۆرجوازی و سەرمایەداری)دا، وەئەمانەی پێشەوە باسمان کردن موسڵمان نین و، پەروەردەکردنیشیان جودایە لەگەڵ پەروەردەکردنی (موسڵمانێکی تەقلیدی)دا، هەروەها پەروەردەکردنی (موسڵمانێکی چاو بەستراو و گوێ نەگر) جیاوازە لەگەڵ پەروەردە کردنی (موسڵمانێکی چاوو هۆش کراوە و گوێگر)دا، دیسانەوە پەروەردەکردنی کۆمەڵگایەك کەقورئان تیایدا حاکمەو تەعالیم و ئادابی ئیسلام باڵی بەسەردا کێشاوە جیاوازە لەپەروەردەکردنی موسڵمان لەکۆمەڵگایەك کەجاهیلیەت و ئیسلام لەمل ملانێ‌و، کوفرو ئیمان لەبەر

بەرەکانێدان.. بەڵێ پەروەردەکردنی موسڵمانێك کەئیسلام لای ئەو تەنها نوێژو ڕۆژووو زیکرو دۆعایە، وەکاتێ کەباسی زەلیلی موسڵمانانی لادەکرێ (لاحول ولا قوة)ێك دەڵێت و سەرێکی بۆ رادەوەشێنێت و پشت هەڵدەکات، زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ پەروەردەکردنی موسڵمانێکدا کەغیرەت و شەهامەت و جوامێری لەکردارو گوفتاری دا رەنگی داوەتەوە و بەبیستنی ئاوەها هەواڵێك وەك شێر لەسەر ئاگر هەڵدەچێت و قوڵپی گریان و نیگەرانی سەرو سیماو دڵ و دەروونی دادەگرێت.. وەهەر ئەو غیرەتە هانی دەدات بۆ کارکردن و گۆڕینی حاڵی نالەباری ئیسلام و موسڵمانان، وەهەرگیز واقیع ملی پێ کەچ ناکات و نایگۆڕێ.. بەڵکو کار دەکات تاواقیع بگۆڕێ بەو جۆرەی کەخوای گەورە فەرمانی پێ دەکات.. وەهیچ عوذرو بەهانەیەك ناهێنێتەوە بەوەی کەئەو واقعە بەقەزاو قەدەری خوا بزانێت، بەڵکو باوەری بەوە هەیە کەدەبێ خۆی بێتە قەزای سەرکەوتوی پەروەردگارو قەدەرێك کەگەڕانەوەی بۆ نی یە.. وەموسڵمانێکە کار دەکات بۆ پیادەکردنی پەیامی خوای مەزن و دامەزراندنەوەی ئوممەتی پێغەمبەرو زیندوو کردنەوەی شارستانێتی ئیسلام.

* * *

# هەنگاوی یەکەم لەبەشی یەکەم

## نەفس چی یە؟

دەرون (نفس)و گیان (روح) لەیەك جودان.. وەهەریەکەیان بەمانای جیاواز هاتوون.. (ابن رشد) لەپێناسەی نەفسدا دەفەرموێ: **(ان حقيقة النفس نشاط وادراك عقلي).**

(ابن مسكوية)ش دەڵێ: **(ان النفس جوهر بسيط غير محسوس بشيء من الحواس تدرك وجود ذاتها وتعلم انها تعلم وتعمل)..**

ریشەی کوفرو ئیمانو هیدایەتو گومڕایی و ئارامی و رازی بوونو رق و کینە.. هتد، هەموو ئەمانە پابەندن بەنەفسەوە.. چاك بوونی نەفس یانی چاك بوونی هەموو لایەنەکانی ئادەمیزاد.

**دەبینین لێرەدا چەند جۆر نەفس لە قورئاندا هاتووە کەئەمانەن:-**

١- **نفس الأمارة بالسوء**: واتە ئەو نەفسەی کەفەرمان دەدات بەسەر خاوەنەکەیدا بەکاری خراپە، کەئەمەش نەفسی بێ باوەڕانو ناپاکانەو وەکو خوای گەورەش دەفەرموێت: ***«ان النفس لأمارة بالسوء، الا مارحم ربي»***. سورەتی یوسف.

٢- **نفس اللوامة**: ئەم جۆرەش نەفسی ئەو بڕوادارانەیە کەجارجار هەڵەو تاوان دەکاو بەلام خۆی سەرکۆنەو سەرزەنشتی خۆی دەکاو نارازیی یە بەو تاوانەی کەکردویەتی، ئەمەش نەفسێکە کەخوای گەورە سوێندی پێ دەخوات، وەکو دەفەرموێت: ***«لااقسم بيوم القيامة، ولا اقسم بالنفس اللوامة»***. سورەتی القيامة.

٣- **نفس المطمئنة والمرضية**: ئەم نەفسەش نەفسی پێغەمبەرانو پیاوچاکانو خواناسانەو لەخواپەرستیدا بەپلەیەك گەیشتووە کەخوای

لەخۆی رازی کردووەو بەدڵنیایی و ئارامی یەوە بەرەو لای خوای خۆی دەگەڕێتەوە، هەروەکو پەروەدگار دەفەرموێت: «*یاأیتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية*» سورەتی الفجر.

بەهۆی گرنگی نەفس و پەروەردەکردنی نەفسەوە، لەقورئاندا ئەم ووشەیە بەم جۆرە هاتووە:-

**١- ووشەی «النفس» ١٢٦ جار.**

**٢- ووشەی «نفوس» ٢ جار.**

**٣- ووشەی «انفس» ١٥٣ جار.**

**هەمووی «٢٨١» جار هاتووە.**

ئاشکرایە ووشەیەك «٢٨١» جار لەقورئاندا دووبارە کرابێتەوە، ئەوە گەورەیی و گرنگی ئەو ووشەیە دەگەیەنێت.

# چۆنیەتی پەروەردەی نەفس

١- هیدایەت و ڕێنمونی کردنی نەفس بۆ سەر ڕێگەی ڕاستی خواناسی و یەکتاپەرستی، وەکو دەفەرموێت: «*من اهتدى فانما يهتدي لنفسه، ومن ضل فانما يضل عليها*» سورەتی الأسراء.

واتە: کەسێ ڕێگەی هیدایەت بگرێت ئەوە هیدایەتی نەفسی خۆی داوەو ڕزگاری کردووە، وەکەسێکیش ڕێی لێ وون بێت ئەوە نەفسی خۆی گومڕاو سەر لێشێواو کردووە.

٢- ذیکرو یادی خوا لەنەفسی خۆتا بەپەنامەکی، وەکو دەفەرموێت: «*واذكر ربك في نفسك تضرعا وخيفة*». سورەتی الأعراف/٢٥.

واتە: یادی پەروەردگارت بکە لەزاتی خۆتا بەپەنامەکی و زەلیلی و ترسانت لەخوا لەگەڵ حازرکردنی دەسەڵات و گەورەیی خوا لەدەرونتا.

٣- تەزکیەو خاوێن کردنەوەی نەفس لەهەموو جۆرە بێ باوەڕی و ئاکارو ڕەوشتێکی پەست و نابەجێ، وەکو خوای کاربەجێ دەفەرموێت:-

«*قد أفلح من زكاها وقد خاب من دساها*».

واتـه: بـه‌ختـه‌وه‌ره ئـه‌وه‌ی نـه‌فـسی خـۆی پـاك و خـاوێـن كـردە‌وه‌، وه‌زه‌ره‌رۆمـه‌نده ئـه‌وه‌ی كـه‌بـه‌تـاوان و گـونـاه نـه‌فـسی خـۆی پیس و ڕه‌ش كردە‌وه‌.

٤ -تـه‌وبـه‌و گـه‌رانـه‌وه بـۆ لای خـوای گـه‌وره‌، وه‌كـو كـه ده‌فـه‌رمـوێ: «وتوبوا الى الله جميعا أيها المؤمنون لعلكم تفلحون».

واتـه: هـه‌موو تـه‌وبـه بكـه‌ن و بـۆ لای خـوا بگـه‌ڕێنـه‌وه ئـه‌ی ئیمانداران بـه‌ڵكو ڕزگارتان ببێت.

پێغه‌مبه‌ری ئـه‌كره‌میش (ﷺ) ده‌فه‌رموێت: **(يأيها الناس توبوا الى الله، فأني اتوب في اليوم مائة مرة، وان الله عزوجل يبسط يده بالتوبة لمسيء الليل الى النهار ولمسيء النهار الى الليل حتى تطلع الشمس من مغربها)** رواه مسلم.

واته: ئه‌ی كۆمه‌ڵی ئاده‌میزاد بگه‌ڕێنه‌وه بۆ لای خوا، وه‌من له‌شه‌و و رۆژێكدا سه‌د جار ته‌وبه ئه‌كه‌م و ئه‌گه‌ڕێمه‌وه بۆ لای خوا، وه‌خوای گه‌وره‌ش ده‌ستی لێخۆشبونی واڵا ئه‌كاته‌وه بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی كه به‌شه‌و تاوان ده‌كات، هـه‌تا ڕۆژ ده‌بێته‌وه‌، وه‌ده‌ستی لێخۆشبونی واڵا ده‌كاته‌وه تاشه‌و بۆ ئـه‌و كه‌سه‌ی كه‌به‌ڕۆژ تاوان ده‌كات.

٥- موراقه‌به‌و چاودێری كردنی په‌روه‌ردگار هه‌رده‌م به‌سه‌رخۆته‌وه‌، وه‌بۆ په‌روه‌رده‌ی نه‌فس پێویسته موسوڵمان له‌هه‌موو كات و شوێنێكدا خوای گه‌وره به‌ره‌قیب و چاودێر بزانێت به‌سه‌ر خۆیه‌وه‌، تاله‌گه‌ڵ خواو له‌په‌نای خوادا بژی و پارێزراو بێت له‌هه‌ڵه‌ی نه‌فسانی وشه‌یتانی، وه‌خوای گه‌وره‌ش ده‌فه‌رموێت «واعلموا ان الله يعلم مافي أنفسكم فاحذروه» سوره‌تی البقرة، واتـه: بزانن كه‌خوا ئه‌زانێ ئـه‌وه‌ی لـه‌ده‌رونتانایه خۆتانی لێ بپارێزن.... هـه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت: «.. ان الله كان عليكم رقيبا»، واتـه: بـه‌ڕاستی خوا چاودێره به‌سه‌رتانه‌وه‌.

هـه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری پێشه‌واش ده‌فه‌رموێت: **(اعبدوا الله كأنك تراه، فأن لم تكن تراه فأنه يراك)**، واتـه: خواپه‌رستی بكه به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك كه‌وا بزانی ده‌ی بینی، وه‌ئه‌گه‌ر نه‌یشی بینی ئه‌وا بزانه ئه‌وتۆ ده‌بینێ.

٦- موحاسه‌به و لێپرسینه‌وه‌ی نه‌فس (١): ژماريارو سه‌رزه‌نشت

لۆمە کردنی نەفس هەردەم پێویستە.... مادام ئادەمیزاد شەوو ڕۆژ لەکاردایە وەدەیەوێت بۆ هەمیشە بەختەوەرو سەرفراز بێت دەبێت بەم جۆرە بڕوانێتە کارەکانی خۆی لەئاستی فەرمانەکانی خوای گەورەدا، وەکو بازرگانێك چۆن دەڕوانێتە سەرمایەو دەست مایەی خۆی ئاوەهاش بڕوانێتە فەرزو واجبەکانی خوای گەورەو سوننەتەکانی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، هەروەها چۆن دەڕوانێتە لەدەست دانی دەست مایەو سەرمایەی خۆی ئاوەهاش بڕوانێتە تاوان و گوناهەکانی خۆی... پاش ئەوەی کەمامەڵەکەی تەواوبوو باکاتێك دابنێ وەبیربکاتەوەو سەرنجێکی ئەو مامەڵەیە بدات و بزانێت ئاخۆ زەرەری کردووە یان قازانج؟... جائەگەر زەرەری کردبوو -**تاوانی کردبوو**- باداوای لێخۆشبوون لەخوای میهرەبان بکات و هەوڵی زیادبوون و ..اك بوونی فەرزو سوننەتەکانی بدات... خوای کاربەجێش دەفەرموێت ***«یاأیها الذین امنوا اتقوا الله ولتنظر نفس ماقدمت لغد واتقوا الله ان الله خبیر بما تعملون»***.

عومەری کوڕی خەططاب -ڕەزای خوای لێ بێت- کەشەو دادەهات بەعەصاکەی لەقاچی خۆی دەداو بەنەفسی خۆی دەگوت ئەمڕۆ چیت کردووە؟ وەبە موسوڵمانانیشی دەفەرموو: (**حاسبوا انفسکم قبل أن تحاسبوا أو توزنوا**).

**٧- موجاهەدەو تێکۆشان لەبەربەرەکانێ و دژایەتی نەفسدا:**

وەپێویستە مرۆڤی موسوڵمان بزانێ کەدوژمن ترین دوژمن بۆ خۆی نەفسی خۆیەتی (**اعدی عدوك نفسك بین جنبیك**)، وەبەڕاستی ئەگەر جیهادی نەفس گەورەترین جیهاد نەبێت، ئەوا یەکێکە لەو جیهادانەی کە ... جیهادەکانی تر لەسەر ئەو ڕاوەستاون و بەوەوە پابەندن... چونکە تاجیهادی نەفس و دەروونی خۆی نەکات، هیچ کات جیهادی خەڵکو کەسانی تری پێ ناکرێت.. وەپێویستە ئاثاری ئەو جیهادی نەفسە لەسیمای نمایان بێت، وەکو أمیر المؤمنین علی کوڕی أبي طالب -کرم الله وجهە- دەفەرموێت: (**رحم الله أقواما یحسبهم الناس مرض... وذلك من اثار المجاهدة النفس**).

ئایا هیچ کەسێك بەئەندازەی حەزرەت (ﷺ) جیهادی نەفسی کردووە؟

کەلەشەونوێژدا ئەوەندە ئەمایەوە تاقاچی پیرۆزی ئەئاوسا... حەزرەتی عائیشە -رەزای خوای لێ بێت- دەیفەرمو بۆ ئەوەندە خۆت ئەزیەت دەدەیت؟ مەگەر خوای گەورە لەئەوەڵ و ئاخرت خۆش نەبووە؟... ئەویش دەیفەرموو: (افلا أكون عبدا شكورا)، واتە: بۆچی؟ بەندەیەکی سوپاسگوزاری خوا نەبم؟.

جیهادی نەفس بەئاوات و خۆزگە خواستن نایەتە دی... بەڵکو بەلێبڕان و بەرگری کردنی نەفسە لەهەواو ئارەزوواتی ناڕەوا، شاعیریش جوانی گوتووە کەدەڵێت:

**ترجو النجاة ولم تسلك مسالكها**

**ان السفينة لاتجري على اليبس**

واتە: بەهیوای ڕزگاریت، بەڵام ڕێگای ڕزگاریت نەگرتووە... بابزانیت کەناتوانیت کەشتی بەووشکانیدا بەریت.

خوای گەورەش موجاهەدەو بەرگری کردنی نەفس لەتاوان بەمایەی ڕزگاری و چوونە بەهەشت دەزانێ و دەفەرموێت *«وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى، فأن الجنة هي المأوى»*.

یەکێ تر لەپەروەردەکردنی نەفس بەکەم زانین و سادە سەیرکردنی ژیانی دنیایەو ڕازی نەبوونە پێ ی... وەك خوای گەورە دەفەرموێت *«أرضيتم بالحياة الدنيا من الأخرة، فما متاع الحياة الدنيا في الأخرة الا قليل»*.

هەروەها یەقین بوون بەبەجێ هێشتنی کۆتایی ژیانی دنیا، پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت *«كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والأكرام»*.

❊ ❊ ❊

# هەنگاوی دووەم لەبەشی یەکەم

## عەقڵ و هۆش

گوتمان هەنگاوی یەکەم لەدەست پێکردنی پەروەردە بریتی یە لەپەروەردەکردنی نەفس... ئێستە دێینە سەر باسی هەنگاوی دووەم کەپەروەردەی (عەقڵ و هۆش)ـە... پەروەردەکردنی عەقڵ بەجۆرێ گرنگ و پێویستە کەهەموو ئەحکام و فەرمان و تەکلیفی خواو پێغەمبەرەکەی لەسەر بوون و ساغی عەقڵ راوەستاوە.. کەعەقڵ نەبوو یان تەواو نەبوو ئەوا هیچ جۆرە تەکلیفێك رووی تێ ناکات و لەئاستی خواو خەڵکدا بەر پرسیار نی یە.

مرۆف خاوەنی دوو جۆر (عەقڵ)ـە... یەکەم عەقڵێك کەبەهۆی ئەوەوە مرۆف هەست (شعور) بەخۆشی و ناخۆشی ژیان دەکات و چاکە و خراپە لەیەك جیادەکاتەوە و خۆیشی بەهۆی ئەو عەقڵەوە لەئاژەڵ و باقی گیاندارەکانی تر جیا دەبێتەوە.... دووەم عەقڵێکە کەبەهۆی ئەوەوە مرۆف بیر لەژیان و بوونەوەر دەکاتەوە و بەدیهێنەر (خالق)ی خۆی دەناسێت و رێگای سەرفرازی و بەختەوەری هەمیشەیی دەگرێتە بەر.. وەتێ دەگات کەژیان چی یە؟... لەکوێوە هاتووە؟ کێ هێناویەتی؟ مەبەست لەهاتن و دروست بوونی چی یە؟ بۆ کوێ دەچێت؟..

لەقورئانی پیرۆزدا (٣٠٠) جار باسی عەقڵ کراوە و ناوی براوە... وەبانگی خەڵکی کردووە بۆ پتەوکردن و بەهێزبوونی عەقڵ، هەروەها ئایات و نیشانەکانی پەروەردگار لەبوونەوەردا بۆ خاوەن عەقڵ و هۆشەکان هاتووە.. وەکو خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ***«ان في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لايات لأولي الألباب»*** .

واتە: لەئاسمانەکان و زەوی و گۆڕانی شەو و رۆژ چەندین بەڵگە و نیشانەی خوایی هەیە بۆ خاوەن عەقڵەکان... وەچەندین ئایەتی لەم جۆرە لەقورئاندا هەیە...خوای گەورەش دانایی (حكمة) و شتی چاك هەر بەخاوەن

عەقڵەکان دەدات، وە ئەوانیش کاربەجێیی و دانایی و چاکەی خوا دەزانن و بیری خۆیان و خەڵکی دێننەوە... پەروەردگاریش دەفەرموێت: ***«يؤتي الحكمة من يشاء ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيرا كثيرا وما يذكر إلا أولو الألباب»***.

واتە: دانایی خۆی دەبەخشێت بەکەسێك کەخۆی ئارەزووی لێ بەتی، وەکەسێکیش دانایی پێ ببەخشرێت ئەوە چاکەی زۆری پێ بەخشراوە، کەسیش بەم دانایی یە نازانێت و وەبیری ناخاتەوە خاوەن (عەقڵ)ـەکان نەبێت.

پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ) دەربارەی گەورەیی عەقڵ دەفەرموێت: **(ان لكل شيء دعامة، ودعامة المؤمن عقله، فبقدر عقله تكون عبادته اما سمعتم قول الفجار في النار قالوا لو كنا نسمع أو نعقل ماكنا في أصحاب السعير)** أخرجه الحارث.

واتە: بۆ هەموو شتێك ستوون و کۆڵەکە هەیە، وەستوون و کۆڵەکەی ئیماندار عەقڵیەتی، وەعیبادەت و خواپەرستیشی بە ئەندازەی عەقڵەکەیە، مەگەر ئەتان بیستووە وتەی ئەو تاوانبارانە لەدۆزەخدا کەدەڵێن ئەگەر بمانویستایە و عاقڵ بووینایە نەدەچووینە ناو دۆزەخەوە.. لێرەدا دەبینین کەخراپترین گیانلەبەر لای خوای گەورە ئەوانەن کەخۆیان کەرو لاڵ و بێ عەقڵ دەکەن لەئاستی راستیدا، وەکو خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ***«ان الشر الدواب عندالله الصم البكم الذين لايعقلون»***.

دیارە کەعەقڵ کەم و زۆری هەیە، وەلەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازی هەیەو دەگۆرێت، وەکو حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت: **(أصنافا شتى۔ فمن الناس من أعطي حبة، ومنهم من أعطي حبتين، ومنهم من أعطي الثلاث والأربعة۔ ومنهم من أعطي أكثر من ذلك)** رواه أنس والترمذي.

واتە: خاوەن عەقڵەکان جۆراو جۆرن.. کەسی واهەیە بەقەدەر دەنکە دانەوێڵەیەك عەقڵی پێ دراوە، هەیە بەقەدەر دوو دانەوێڵەو هەیشە بەقەدەر سێ یان چوار دانەوێڵە...وەهەیشە لەوە زیاتر عەقڵی پێ بەخشراوە.

دەپاش ئەوەی کەزانیمان عەقڵ باشترین و گەورەترین دەستمایەو سەرمایەی ئادەمیزادە.. وەسەرچاوەی بەختەوەری و سەرفرازی هەمیشەیی یەتی... وەچرای رووناکی یەتی بۆ دۆزینەوەی رێگەی راست...

بەڵێ کەعەقڵ نەبێت ئەوا مرۆڤایەتی و ژیان و بەختەوەریش نامێنێت.. وەمادام خوای گەورە بە هۆی عەقڵەوە رێزی لێ گرتووین و رێزداری کردووین، ئەوا داواشمان لێ دەکات بۆ پتەوکردن و خاوێن کردنەوەی عەقڵ.. هەروەها پێویستە هەوڵی بەدەست هێنانی ئەو وەسیلانە (هۆیانە) بدەین کەوزەو توانایی عەقڵ زیادو بەهێز دەکەن.... ئەو هۆیانەش دوانن:-

**یەکەم** : دانانی بەرنامەو پرۆگرامێکی دروست بۆ بیروبۆچونی عەقڵ لەئاستی راستی و ناراستی یەکاندا و خۆ دەربازکردن لەو شتانەی کەلەسەر شك و گومان راوەستاوون، وەبەشوێن کەوتن و گوێگرتنی کوێرانە وەرگیراون..

**دووەم** : بۆ بەروکردنەوەی ووزەی عەقڵ بیرکردنەوەو تێ روانینیەتی لەدەستووری یاسای بوونەوەرو ئەوەی واتیایدا.. تا بەهۆی ئەوەوە دانەرو دروستکەری ئەم بوونەوەرە بدۆزرێتەوەو بیناسێت و بەندایەتی بۆ بکات.. کەبەبێ بوونی بەدیهێنەر ژیان مەحاڵە، وەکو (کریس مورسیون) لەکتێبی «العلم یدعو للأیمان»دا دەڵێت: (ان وجود الخالق تذل علیه تنظیمات لا نهایة لها تكون الحیاة بجدونها مستحیلة.. وان وجود الأنسان علی ظهر الأرض والمظاهر الفاخرة لذكائه: انما هي جزء من برنامج ینفذه باريء الكون).

واتە: ئەم بوونەوەرە جوان و رازاوەو بەرین و بێ ئەمسەرو سەرە بەڵگەیە بەسەربوونی دروست کەرێك کەژیان بەبێ ئەو بەدیهێنەرە مەحاڵە... وەبوونی مرۆڤ لەسەرپشتی زەوی و ئەو دیاردە زیرەکی یانەی کەجێگای شانازین بەشێکە لەو بەرنامەیەی کەبەدیهێنەری بوونەوەر ئەنجامی دەدات.

وەسەرەرای ئەمانەش: بوونی عەقڵێکی نادیارو بێ رەنگ و بۆ و فەرمانرەوا بەسەر لاشەی مرۆڤدا باشترین بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری بوونەوەرو خوای کاربەجێ.

# هەنگاوی سێهەم لەبەشی یەکەم

## پەروەردەی بەدەن
## (التربية الجسمية)

بێ گومان هەروەکو ئیسلام بەرنامەیەکی گشتیی و هەمە لایەنەیەو هەمو کات و شوێنێی مرۆڤ دەگرێتەوەو شیاوەو دەشیەت، هەروەها لەبواری پەروەردەشدا بەشێوەیەکی هەمە لایەنە بۆ ئادەمیزاد دەڕوانێت بەتەنها خۆ بەپەروەردەی رۆحیی و مەعنەوی یەوە خەریك ناکات و لایەنی ماددیی و بونیەی دەست لێ بەردات.. بەڵکو مێژووی یەکەمین قوتابخانەی ئیسلام ئەوەمان بۆ دەردەخات کەمامۆستای ئەو قوتابخانەیە - پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) - لەماوەی (٢٣) ساڵدا هەر بەگۆڕینی سلوك و رەوشتی یارەکانی یەوە خەریك نەبوو... بەڵکو بەجۆرێ پەروەردەی بەدەنی و لاشەیی کردن کەبتوانن سەرەرای بەرگری کردن لەخۆیان و باوەرەکەیان گرانترین و گەورەترین باری ئەمانەت لەسەر شان بگرن و بیگەیەنن بە هەزاران هەزار مرۆڤی کۆیلەو چاو بەستراوو ژێر دەستە.. کەئەو ئەمانەتە کەلام و فەرمودەکانی پەروەردگارن ***(انا سنلقي عليك قولا ثقيلا)*** شاهیدی ئەم ووتەیامانە.... لەبەرئەوەی کەمرۆڤی موسوڵمان دەچێتە ژێر باری لێپرسراوێتی خواو خەڵکی، وەهەموو ژیانی بریتی یە لەهەوڵ و تێکۆشان بۆ گەیشتن بەرەزامەندی خوای گەورە... وەمرۆڤی ناموسڵمان و بێ باوەڕیش یانی راکردن و خۆ دەربازکردن لەهەر جۆرە بەرپرسیارێتی یەك جگە لەسوودی شەخصی خۆی... کەواتە مرۆڤی موسڵمان لەهەموو کەس زیاتر ئاتاج و پێویستی بەلاشەی ساغ و بەهێزو خاوێن هەیە... وەراستیان کردووە کەدەڵێن (العقل السليم في الجسم السليم)، واتە: عەقڵی ساغ و تەواو لەلاشەی ساغ و تەواودایە.

هەروەها ئیسلام بۆ پەروەردەی بەدەن بەرنامەی چروپڕی بۆ داناوە،

کەجگە لەبەهێز کردنی بەدەن بایەخی باشیشی بەپاك و خاوێنی بەدەن داوە... تەنانەت بەشێکی زۆر لەعیبادەت و بەندایەتی یەکان بۆ بەهێزی و پاك و خاوێنی بەدەنە جگەلەوەی کە بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە وەکو نوێژو دەست نوێژو و ئەو مەرجانەی کەدەبێ لەنوێژدا ئەنجام بدرێ.

زانایەکی ئینگلیزی بەناوی (بنتام) ئەم راستی یە دەسەلمێنێ و دانی پیادا دەنێ و دەڵێت: (ان من واظب على الطهارة الشرعية في الدين الأسلامي خلا من الذنوب وبرئت نفسه من العيوب، ولقد استقيدت المجرمين الذين جمعتهم السجون فلم أر فيهم الأقذر الجسم وسخ الثياب)...

واتە: بەراستی هەر کەسێ پابەندو بەردەوام بێت لەسەر ئەو پاکێتی یە شەرعی یەی کەلەدینی ئیسلامدا هەیە، ئەوە لەتاوان خاوێن دەبێتەوەو خۆی لەهەڵە پاك دەکاتەوە.. وەمن زۆرێك لەو تاوانبارانەم دی کەزیندانەکان کۆی کردبوونەوە، نەمدی تیایاندا جگە لەکەسانێکی بەدەن پیس و لیباس چڵکن نەبێ.. بەڵێ هەروەکو خراپەو تاوان کەسانێك دەیکەن کەبەدەن پیس و لاوازو دڵ نەخۆشن..

هەروەها زۆربەی دەردو نەخۆشی لەپیس و چەپەڵی و کەسانێك پەیدا دەبێ و سەرەڕای ئەداو تووش دەبن کەپیس خۆرو خۆنەپارێزو دەس و لیباس و چاو چڵکنن.

پێغەمبەری پێشەوامان بۆ پاك و خاوێنی بەدەنمان و جیابوونەوەشمان لەغەیرە موسڵمان دەفەرموێت: (خمس من الفطرة: الختان والاستمداد وقص الشارب وتقليم الاظافر ونتق الابط) متفق عليه ـ الجامع الصغير.

واتە: پێنج شت سروشتی و رەوشتی بەرزی ئادەمین: خەتەنەکردن و بەرتاشین و کورت کردنەوەی سمێڵ و نینۆك کردن و هەڵکێشانی توکی بن باڵ.

وەلەسەر بنچینەی ئەم فەرموودەیەی حەزرەت (ﷺ) (وان لبدنك عليك حقا) ئیسلام بەرنامەی تایبەتی بۆ پاك و تەمیزی، چۆنێتی خواردن و خواردنەوە، نوستن و لەخەوهەستان، دیاری کردنی ئەو خۆراکانەی

کەحەرامن و هەرەشەکردن لە خواردنیان، دەست نیشان کردنی دەردو نەخۆشی یەکان و چارەسەرکردن و ناسینی دەرمانەکان بەدەیان ئایەت و حەدیث بەیانی کردووەو روونی کردۆتەوە کەلەم نامیلکەیەدا جێگای نابێتەوە.

وەلەبارەی چۆنێتی پەروەرشی بەدەن و بەهێز بوونی بەوەرزش و فێر بوونی مەلەوانی و ئەسپ سواری و سایەقی و پرپێکی و تیرئەندازی و دەیان یاری و وەرزشی تر.. بەم ئایەتە فەرمانمان پێ دەدات، وەراستەوخۆ ئامارە بەهەموو جۆرە وەرزش و یاری یەك دەكات کەبێتە هۆی بەهێز بوونی لاشە دەفەرموێت: *[ وأعدوا لهم ماستطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم وآخرين من دونهم لاتعلمونهم الله يعلمهم]*(١).. ئەم ئایەتە پیرۆزە سەرەرای ئەوەی کەفەرمانمان پێ دەدات بۆ بەهێز بوونی بەدەن بەهەر جۆرە وەرزش و یاری یەك بێت.. ئەوەشمان پێ رادەگەیەنێت کەهەدەف و مەبەست لەم هێزو بەهێز بوونە چی یە؟ ترساندنی دوژمنانی خواو خۆمان کەجورئەتی ئەوە نەکەن رێگە لەدینی خواو بانگەوازی پیاوانی خوا بگرن.

هەروەها موسڵمانی بەهێزو توانا چاك ترەو خۆشەویست ترە لای خوا لەموسڵمانی لاوازو بێ هێز وەکو حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێ (المؤمن القوي خير واجب الى الله من المؤمن الضعيف).

دەگێرنەوە رۆژێك پێشەوامان (ﷺ) تێ دەپەرێ.. کاتێ نزیکی ساحەیەك بووەوە کەیارەکانی تیایدا وەرزشیان دەکردو پێڵاوەکانی لەپێ داکەندو فەرموی (روضة من رياض الجنة).. واتە: ئەم شوێنە باخچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت.

وەکاتێ بەهۆی پەروەردەو وەرزش و یاری یەوە بەدەنمان بەهێزو توانا بوو.. ئیسلام رێمان نادات کەئەو تواناو هێزە لەهەموو شوێنێکدا بەکار بێنین.. وەیان پێ ی مەغروربین و سوودی شەخصی پێ وەرگرین.. بەڵکو پێمان دەڵێ کەکەی وەلەکوێ و لەگەڵ کێ دا توندو تیژ وەیان نەرم و نیان بین.. وەلەئاستی کێدا خۆ بەزل بزانین و لەئاستی کێشدا خۆ بەکەم بگرین. دەفەرموێت: *[محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم]*.

واتە: (محمد پێغەمبەری خوایەو ئەوانەی شوێنی ئەو پێغەمبەرە کەوتوون توندو تیژو رق ئەستورن لەسەر بێ باوەڕان و میهرەبان و بەبەزەیین لەنێوان خۆیاندا.)

وەئیسلام رێگەی ئەوەشمان نادات کەهەر بەلاشەو بەدەنەوە خۆ خەریك بکەین و وەکو ئاژەڵ لاشەیەکی بێ هۆش و بەدەنێکی بێ رۆحی مەعنەویمان بێت و هەر کاتێ ماڵمان نەبوو دزی بکەین، هەرکات ئارەزووی جنسی زۆری بۆ هێناین زینا بکەین، وەیان هەر کاتێ نەفس داوای حەرامی لێ کردین بیکەین.. چونکە ژیان تەنها خواردن و خەوو رابواردن نی یە، وەکو بێ باوەڕانی ئەمڕۆ دەیڵێن.. بەڵکو ژیان خۆشەویستی یە، سۆزو بەزەیی یە هاوکاری و بەدەم یەکەوە هاتنە.. ئەمە کورتەیەك بوو لەپەروەردەی ئیسلام بۆ رۆح و عەقڵ و لاشە.

* * *

بەشی دووهەم

# جۆرو شێوازی پەروەردە

بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بین لەپەروەردەکردندا، وەیان پەروەردەیەکی سەرکەواتوانەمان هە بێت.. پێویستمان بەپەروەردەی جۆراو جۆر وەیان شێوازی جۆراو جۆری پەروەردە هەیە.. شێوازی پەروەردە زۆرن، بەلأم ئەوانەیان کەپێویست بن بۆ ئێمە ئەمرۆ ئەمانەن:

١- پێشەنگی و چاولێکەری (التربية بالقدوة).

٢- ئامۆژگاری (التربية بالموعظة).

٣- سزادان (التربية بالعقوبة).

٤- چیرۆك و بەسەرهات (التربية بالقصة).

٥- نەریت و باو (التربية بالعادة).

٦- رووداوەکان (التربية بالاحداث).

# خالی یەکەم لەبەشی دووهەم

## پەروەردەی چاولێکەری (التربية بالقدوة).

پەروەردە بەپێشەنگی و چاولێکەری سەرکەوتووترین و باشترین پەروەردەیە.. چونکە ئەم شێوە پەروەردەیە تەرجەمەو رەنگدانەوەی ئەو بیرو باوەڕەیە کەخاوەن پەروەردە هەڵی گرتووەو خەڵکی بۆ بانگ دەکات.. وەهۆی ئەوەی کەپێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) بەتەنها توانی لەماوەی (٢٣) ساڵدا باوەڕی خوا لەدڵی زۆربەی دانیشتوانی (جزيرة العرب)دا جێگیر بکات ئەو خاکە لەشرك و بت پەرستی پاك بکاتەوە.. وە(١٥٠٠٠٠) صەدو پەنجا هەزار سەربازی پەروەردەکراو لەدەوروبەری دیینەکەیدا کۆبکاتەوە.. هۆی سەرەکیش ئەوە بوو کەشەخصی پێغەمبەر (ﷺ) هەیکەل و پەیکەرو وێنەیەکی تەواو بوو بۆ ئەو پەیامەی کەفەرمانی پێ درابوو رایگەیەنێت.. وەخۆی پێشەنگی خەڵکی بوو بۆ ئەوەی کەدەیفەرموو.. وەکو خوای کار بەجێ دەفەرموێت: *[ولكم في رسول الله أسوة حسنة]* واتە: (بۆ ئێوە هەیە لەپێغەمبەری خوادا چاولێکەرییەکی چاك و بەجێ... وەبۆ چەسپاندنی ئەم

راستی یە باگوێ لەدایکی ئیمانداران «خاتوو عائیشە» بگرین کاتێ کە پرسی یان لەرەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) چی فەرمووا فەرمووی: (کان خلقە القران) واتە: رەوشتەکانی پێغەمبەر قورئان بوو....

کەواتە پێشەوامان سەرەرای ئەوە کە پەروەردەکارێك و بانگەواز خوازێك بوو بۆ لای خوا بەسلوك و رەوشتی لەگەڵ ئەوەشدا بەدەن و لاشەیەك بووە بۆ رۆحی قورئان... ئێمە لێرەدا نامانەوێ بەوەصف و تاریفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بڕۆین، چونکە رۆژ هەوەجەی بەپەنجە بۆ راکێشانی نی یە (وما أرسلناك الا رحمة للعالمین).

مادام وایە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کەدەیەوێ نەفەرێ وەیان جیلێك پەروەردە بکات دەبێت کردارەکانی تەرجەمەو رەنگدانەوەی ووتارەکانی بن... چی بڵێت ئەوەش بکات، تاچی بکات ئەوەش بڵێت.... وەهەروەکو چۆن گەلانی دنیا پیاوانی ناوداری خۆیان دەکەنە پێشەنگ و چاوی لێ دەکەن... پێویستە ئێمەی موسوڵمان، ئێمەی کوردی خاوەن باوەڕ بۆ پەروەردەی خۆمان و گەلەکەمان و، وەبۆ رزگارکردنی گەلەکەمان لەهەموو جۆرە ستەمێك شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەوین... وەچاو لەئاکارو رەوشتە بەرزەکانی بکەین کەتەنها رێگە چارەو رێگەی سەرفرازیمانە.. وەبێگومان رەچەو رێبازی ئەو پێغەمبەرە مەزنەش (ﷺ) تا کۆتایی ژیان هەر بەردەوامە و دەبێت.

❊ ❊ ❊

# خالی دووهەم لەبەشی دووهەم

# پەروەردە بە ئامۆژگاری

# (التربية بالموعظة)

یەکێکی تر لەشێوازەکانی پەروەردە.... پەروەردەکردنە بەئامۆژگاری ئیسلام خۆی لەخۆیدا نەصیحەت و ئامۆژگاری یە...

ئامۆژگاری دەورێکی گرنگی هەیە لەپەروەردەکردندا چونکە زۆر جار قسەیەك تەئثیری وای لەدەروونی نەفەرێك یان كۆمەڵێك كردووە بەجۆرێك كەلەنەفامی یەوە بەرەو ئیسلام گێراوی یەتی یەوە باری ژیانی گۆڕیوون... خوای كاریە جێش دەفەرموێت: ***«أدع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن»***، واتە: بانگی خەڵكی بكە بۆسەر ڕێگەی پەروەردگارت بەدانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، وەبدوێ لەگەڵیاندا بەووتەیەك كەلەووتەی ئەوان باشترە...

وەپێویستە ئەوەش بزانین كەئامۆژگاری یەك شێوازی نی یە بەتەنها... بەڵكو ئامۆژگاری واهەیە بەنەرمی و هێمنی دەكرێت و هەڵنانی تیادا بەكاردێت، وەجاری واش هەیە توڕەیی و هەڕەشەی تیادا بەكاردێت.

هەروەها ئامۆژگاری هەر كۆمەڵ و دەستەیەك جیاوازە لە ئامۆژگاری كۆمەڵ و دەستەیەكی تر.. بابۆ نموونە چەند ئایەتێكی قورئانی پیرۆز كەبەشێوازی جۆراو جۆر ئامۆژگاریمان دەكەن بێنینەوە تابزانین چۆن پەروەردگار لەئامۆژگاری خۆی بۆ بەندەكانی بەشێوازی جۆراو جۆر نەصیحەتمان دەكات، وەكو دەفەرموێت: ***«واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا وبالوالدين احسانا وبذي القربى واليتامى والمساكين والجار ذي القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل وما ملكت أيمانكم ان الله لايحب من كان مختالا فخورا»***.

هەروەها لەئایەتێكی تردا بەجۆرێكی تر ئامۆژگاریمان دەكات و دەفەرموێت: ***«ولا تقف ماليس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسئولا، ولا تمش في الأرض مرحا انك لن تخرق الأرض ولن تبلغ الجبال طولا، كل ذلك كان سيئة عند ربك مكروها»***.

❊ ❊ ❊

# خالی سیهەم لەبەشی دووهەم

## پەروەردە بەچیرۆك
## (التربية بالقصة)

پەروەردە بەچیرۆك و بەسەرهات رۆڵێکی تایبەتی لەنەفس و دەروندا دەگێرێت.. وەلەبەر گرنگی چیرۆك و بەسەرهات (چیرۆك) مەوداو مەیدانێکی فراوانی لەقورئانی پیرۆزدا هەیە، کەهەموو ئەو بەسەرهاتانە بۆ یادکردنەوەو پەندو ئامۆژگاری خوای گەورەو کاربەجێ بەیانی کردوون... جا بۆ ئەوەی لەمەیدانی پەروەردەدا ئەو کەسەی کەپەروەردە دەکات بەجوانترین شێوە نموونەی چیرۆك و بە سەرهات بکاتە بەڵگەو دەلیل لەو باسەی کەدەیکات بۆ گوێگران... وەباشترین چیرۆك ئەو چیرۆکانەن کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتوون.. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت رۆڵ و دەوری گرنگی ئیمان لەگۆڕانی ژیانی کۆمەڵدا بەیان بکەین، ئەوا دەبان نموونەی چیرۆکی قورئانمان دەست دەکەوێت وەکو چیرۆکی هاوەڵانی غار (اصحاب الکهف) کەقورئان دەفەرموێت: ***[نحن نقص علیک نبأهم بالحق، انهم فتیة امنوا بربهم وزدناهم هدی وربطنا علی قلوبهم اذ قاموا فقالوا ربنا رب السموات والارض لن ندعو من دونه إلها لقد قلنا اذا شططا هؤلاء قومنا اتخذوا من دونه الهة لولا یأتون علیهم بسلطان بین فمن اظلم ممن افتری علی الله کذبا].***

وەیان چیرۆك و بەسەرهاتی خێزانەکەی فیرعەون و ئەو هەڵوێستە ئیمانی یەی کە لەبەرانبەری دەسەڵاتدارترین و ستەمکارترین ستەمکاردا پیشانی دات بەجۆرێ کەخوای گەورە دامەزراوی و ئیمان پتەوی ئەو ئافرەتە بەنموونە دەگێرێتەوەو دەفەرموێت: ***[وضرب الله مثلا للذین امنوا امرأة فرعون اذ قالت رب ابن لي عندک بیتا في الجنة ونجني من فرعون وعمله ونجني من القوم الظالمین].***

یاخود لەبەرامبەری ئارامگرتن و خۆراگریدا لەئاستی بەڵاو ناڵەباریدا چیرۆکی حەزرەتی أیوب کەقورئان لەبارەیەوە دەفەرموێت *[انا وجدناه صابرا نعم العبد انه اواب]*.

یان ئەگەر بمانەوێت نموونەی کوڕێکی ئیماندارو باوکێکی بێ باوەڕ بێنینەوە، ئەوا چیرۆک و بەسەرهاتی ئیبراهیم و باوکی دەکەینە بەڵگە بۆ ئامۆژگاری یەکەمان، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: *[اذ قال لابیه یاأبت لم تعبد مالا یسمع ولا یصبر ولا یغن عنک شیئا]*.

یاخود بەپێچەوانەوە باوکێکی ئیماندارو کوڕێگی بێ باوەڕ بەنموونە نەهێنینەوە کەچیرۆکی حەزرەتی نوح و کوڕەکەیەتی کەقورئان دەفەرموێت: *[ونادى نوح ابنه وكان في معزل يابني اركب معنا ولاتكن مع الكافرين قال ساوى الى جبل يعصمني من الماء قال لاعاصم اليوم من امر الله الا من رحم ربي وحال بينهما الموج فكان من المغرقين]*.

نەک تەنها ئەمانە بەڵکو دەیان و دەیان چیرۆک و رازو نهێنی لەقورئاندا وەکو چیرۆکی (موسى) لەگەڵ فیرعەون و (نوح) لەگەڵ قەومەکەی و (لوط) لەگەڵ قەومەکەی و (عیسى و بني ئیسرائل و شعیب و مدین و قەومی عادو ثەمود)و جگە لەمانەیش بەنموونە قورئانی پیرۆز هێناونی لەشێوازی جۆارو جۆری پەروەردەدا بەکاری هێناون.. کەمەگەر ئەوەندە بڵێین کەپەروەردگار راستی کردووەو هەموو شتێکی بۆ ئێمە بەیان کردووە لە پەڕاوەکەی خۆیدا *[وما فرطنا في الكتاب من شيء ونزلنا عليك الكتاب تبينا لكل شيء وهدى ورحمة وبشرى للمؤمنين]*.

واتە: هیچمان لەقورئاندا بەجێ نەهێشتووەو کتابمان بو ناردوویت کەبەیانکەری هەموو شتێکەو رێنموونی و بەزەیی و مژدەیە بۆ ئیمانداران.

جابەبۆچوونی من ئەم چیرۆکانە دەتوانین زیاتر بەکاری بێنین بۆ پەروەردەی منداڵەکانمان.. وەلە م چیرۆکانەوە بۆمان دەردەکەوێ کەئیسلام هونەرو هونەرمەندی و هەستی ئارەزووی لەهەموو روویەکەوە حەرام نەکردووە.. وەبەیانی کردووە بۆمان بەو شێوەیە کەشایستەی بەیان کردن بێت، وەکو چیرۆکی (حەزرەتی موسى)و (کچەکانی حەزرەتی شعیب).

* * *

# خاڵی چوارەم لەبەشی دووهەم

## پەروەردە بەباوو نەریت
## (التربیة بالعادة)

لەراستی دا هەر کەسێك کەلەدایك دەبێت لەسەر نەریت و رەوشتی خواو دینی خوا لەدایك دەبێت.. بەڵام کۆمەڵگای نەزان و شێواو زەلکاوی نەریتی کۆمەڵگای نەفام و خراپ و بەدرەوشت کەباوك و دایکی ئەو منداڵەیش بەو کۆمەڵگەیەوە ئالوودەو لیخن بوون ئەو منداڵە لەرەوشتی پاکی خوایی لادەدەن و دەیانکەن بەجولەکەو گاورو ئاگرپەرست.. وەکو پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) دەفەرموێت: (کل مولد یولد علی الفطرة فابواه یهودانه وینصرانه ویمجسانه) واتە: هەموو منداڵێك لەسەر ئاکارو رەوشتی ئیسلام لەدایك دەبن پاشان باوك و دایکیان دەیانکەن بەجولەکەو گاورو ئاگر پەرست.

بەڵێ راستە منداڵ چاکەو خراپەو خێرو شەری لەباوك و دایکی یەوە وەلەکۆمەڵگاوە یان لەپیشەکەیەوە پێ دەگات و توشی دەبێت.. وەبەچاو لێکردن لەدەورو بەری پیاوی چاك وەیان پیاوی خراپ دەبێت.. کەواتە جیاوازی یەك لەنێوان پەروەردە بەعادەو پەروەردە بەتەقلید نی یە، جانەگەر خێزان و کۆمەڵگا خێزان و کۆمەڵگایەکی نەفامی و دوور لەئیسلام و پەروەردەی ئیسلامی بوو، ئەوا ئەو منداڵەش بەپێ ی ئەوەی کەدیبێتی و تێیدا ژیاوە لەلەو بار دێت.. وەجگە لەدزی و درۆزنی و خیانەتکاری و داوێن پیسی و خۆفرۆشی هیچی تر لەو منداڵە چاوەروان ناکرێت.. هەروەکو کۆمەڵگا نەفامی یەکەی ئێمەو باقی شوێنەکانی تر پیاو خراپی وای بەبارهێناوە کە جگە لەخۆفرۆشی و وڵات فرۆشی بەجۆرێك ئاسایش و گوزەران و ژیانی کۆمەڵگاکەی تاڵ و نالەبار کردووە کەهیچ کەس خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نی یە، وەلەهیچ لایەك ئۆقرەی نی یە.

هەروەها لەم لایشەوە خێزان و کۆمەڵگا ئیسلامی یەکانی ئەمڕۆ لەو شوێنانەدا کەباوو نەریتی ئیسلام باڵی بەسەردا کێشاوە ڕۆڵەی وای پەروەردە کردووەو پیاوی وای بۆ گەل و کۆمەڵ پێگەیاندووە کەوەکو پەروانە لەدەوری بەختەوەری و ئاسایش و ئازادی گەل و وڵاتیا دەسوڕێتەوە.. هەموو ساتێك ئامادەی گیان فیداکردنە لەپێناوی سەرفرازی گەل و رزگاری وڵاتیا.

کەواتە باوو نەریت و چاو لێکردن دەورێکی گرنگ دەگێڕێت لەپەروەردەکردندا.. بۆیە لای زۆربەی زانایانی ئیسلام باوو نەریت (عادة) لەو دە بەڵگەیەی (اصول الفقه) دەژمێردرێت.

وەئیمامی مالکیش نەریت و باوی دانیشتوانی مەدینە بەیەکێك لەو هۆیانە دەزانێت کەشەریعەتی ئیسلام و بیروبۆچوونی باوەڕو فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ دەزانرێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی پەروەردەکردنی هاوەڵەکانی بەر لەهەموو شت لەباوو نەریتی نەفامی دووری دەخستنەوەو بەباوو نەریتی ئایینی ئیسلام ئاشناو پەروەردەی دەکردن.

کەواتە پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کەلەبواری پەروەردەدا دەست بەکارن نەوەی نوێی ئەم گەلە لەباوو نەریتی کوشندەی سەدەی بیستەم بەئاگاکەن و دووریان بخەنەوەو بەباوو نەریتی ئیسلام پەروەردەیان بکەن.

* * *

# خاڵی پێنجەم لەبەشی دووهەم

## پەروەردە بەڕووداوەکان
## (التربية بالأحداث)

پەروەردە بەڕووداوەکان دەوری کەمتر نی یە لەوانەی پێشوی خۆی.. هەرچۆن ژیانی دنیا تێکۆشانی بێ وچان و ڕەنجی پڕ لەشەکەت و پەژارەیە، ئاوهاش پڕە لەڕووداوی جۆراو جۆری تاڵ و شیرین و بەرزو نزمی و.... هتد، خوای کاربەجێش دەفەرموێت: *[ياايها الانسان انك كادح الى ربك كدحا فملاقيه]* واتە: ئەی ئادەمیزاد. تۆ بەردەوام وای لەهەوڵ و تێکۆشانداو بەکۆتایی هاتنی تەمەنت بەرەو لای پەروەردگارەکەت دەچیت.. وەیان دەفەرموێت *[لقد خلقنا الانسان في كبد)* واتە: بەڕاستی ئادەمیزادمان لەرەنج و مشەقەقەت و ناڕەحەتیدا دروست کردووە.

جاهەر وەکو کورد دەڵێ: (لەهەر زەرەرێ عەقڵێ).. هەر روداوێك کەروو دەدات لەژیاندا بەدرێژایی مێژوو پەندێك و عەقڵێك بەجێ دێڵێ بۆ ئەو کەسانەی کەدەرس لەڕووداو وەردەگرێت.. وەڕووداوی جەنگەکانی پێش ئیسلام و جەنگەکانی پاشی هاتنی ئیسلام و جەنگی یەکەم و دووهەمی جیهانی و شۆڕشە یەك لەدوا یەکەکانی گەلی کوردو بێ ئاکام بوونیان و هۆی سەرنەکەوتنیان، وەڕووداوی ڕۆژانەی دنیای ئەمڕۆ: هەریەکەیان پەندو دەرسێکن بۆ پەروەردەکردنی خەڵکی.

ڕووداوەکان دەورو کاریگەری خۆیان بۆ ماوەیەکی زۆر لەدەروونەکاندا دەهێڵنەوە.. دەگێڕنەوە: جارێکیان وەزیرێکی عێراقی بەوەزیرێکی ئینگلیزی دەڵێت بۆچی کاتی خۆی کوردستانتان دابەش کردو حەقتان پێ نەداو فارس و عەرەب و تورك بوون بەدەوڵەت، بەڵام نەتانهێشت کوردیش ببێتە دەوڵەت؟ خۆ کوردستان (٣٠) ئەوەندەی جیبۆتی دەبێت؟!.. لەوەڵامدا وەزیرە ئینگلیزەکە وتی:

(وهل ننسى مافعل بنا صلاح الدين الكردي؟)

**واته: (ئايا لەبیرمان دەچێتەوە کە صلاح الدینی کوردی چی پێ کردین؟)..**

وەیان ئێستاش جەماوەری یابان هەر لە ئەمەریکا تووڕەو بەقینن بەهۆی هێرۆشیماو ناکازاکی یەوە.

وەدەبێ ئەوەش بزانین کەپەروەردە بەرووداوەکان بەپێی جیاوازی رووداوەکان شێوازی پەروەردەکەش دەگۆرێت.. بۆ نموونە پەروەردە بەو رووداوانەی کەلەمەککەدا بووە جیاوازە لەگەڵ پەروەردەیەك بەو رووداوانەی کەلەمەدینەدا رووی داوە.. چونکە پەروەردەکردن لەسەر رووداوەکانی مەککە زیاتر رام هێنانە لەسەر خۆڕاگری و قبوڵ کردنی عەزیەت و ئازارو ئەشکەنجە.. بەڵام پەروەردە لەسەر رووداوەکانی مەدینە رام هێنانە لەسەر بەرگری کردن لەبوون و قەوارەی خۆو گشت موقەدەساتی ئیسلام.. وەبەگژاچوونی ستەمکاران و دوژمنان بەبەکارهێنانی هێزو قووەت، وەرازی نەبوون بەهەر جۆرە ملکەچی و ژێرچەپۆکی و کۆیلەیەتی یەك.

جاهەرچەندە ئەم دوو جۆرە پەروەردەی لەیەك جیان بەلام لەبنچینەو ناوەڕۆکدا یەکێکن و بۆ یەك هەدەف و ئامانجە کەئەویش خۆپاڵفتەکردنە بۆ خواو رەزابوونی خوا.. هەروەها ئەم هاوکێشەو تەوازنەش لەدەرووندا دروست دەبێت.. هەروەها لەئایەتی *[واصبر على مايقولون واهجرهم جميلا]*.... تا دەگاتە... *وقاتلوا المشركيين كافة يقاتلونكم كافة]* هەموو پەروەردەن بەپێی رووداوەکان.. وەمەبەست لەپەروەردەکردن بەرودا‌وەکان ئەوە نی یە کەمەرجی رووداوەکان دووبارە بێتەوە، یان خۆمان دووبارەیان بکەینەوە ــ مەککە دروست کەین و بەرەو مەدینە بچین بەو جۆرەی کەحەزرەت (ﷺ) و یارانی کۆچیان کرد.. بەڵکو مەبەست حیکمەت و دانایی یە لەپەروەردەکردندا بەرووداوەکان.. وەهەدەف و ئامانجیش هەردەم پەیوەندی و جۆشدانی دڵەکانە بەپەروەردگارەوە لەهەموو رووداوو کارەسات و بەسەرهات و مەودایەکدا.. کەئەم دەرگایەش هەردەم ئاوەڵاو کراوەیە لەبەردەم پەروەردەکاراندا.

* * *

# خالی شەشەم لەبەشی دووەم

## پەروەردە بەئازارو سزا
## (التربية بالعقوبة)

کاتێ کەپەروەردگار (مربي) دەزانێ کەئەوانەی ئەم پەروەردەیان دەکات، بەهیچ کام لەو شێوە پەروەردانەی پێشوو پەروەردە نابن.. وەهیچ جۆرە ئامۆژگاریەك کاریان تێ ناکات، وەلەسەر بێ بەندو باوی خۆیان هەر بەردەوامن.. ئەو کاتە دەبێ پەروەردەکار چارەیەکی تریان بۆ بدۆزێتەوە کەسزادانە.. هەرچەندە هەندێ هەن لەمەیدانی پەروەردەدا سزادانیان بەلاوە ناپەسەندو نارەوایە.. بەلام بائەوە بزانن ئەو جیلەی کەبەبێ سزادان پەروەردە دەبێ، وەکو جیلی ئەمڕۆی ئەمریکای لێ دێت، کەهەڵوەشاوەو پەرتەوازەو شیرازەی لەیەك پچڕاوەو هەر کاتو ساتێك چاوەڕێی هەرەس هێنانی لێ دەکرێت.. وەبا ئەوەش بزانین کەسزادان پێویستی هەموو کەسێك نیە.. چونکە ئەوانەی کەبەئامۆژگاری پەروەردە دەبن پێویستیان بەسزادان نیە.. بەلام خەڵکی وەکو یەك نین.. وەپلەو رادەی بیرو تێگەیشتنی خەڵکی یەکسان نینو جیاوازن.. بۆ وێنە کەسانی واهەن تەنها بەئیشارەو ئاماژە بۆ کردنێك تێ دەگاتو ترسو بیم لەپەروەردگار دڵی رادەچڵەکێنێو دەست بەجێ لەو خراپەیە دەگەڕێتەوە.. وەکەسانی وایش هەیە دەبێ لێی توورەبینو هەڕەشەی لێ بکەینو ئەوسا دەگەڕێتەوە جا یان بەهەڕەشەی سزای پاشەڕۆژ دەیترسێنین، وەیان سزایان بدەینو ئازاری لەشیان بدەین تاڕاست دەبێتەوە.

وەدەبێ ئەوەش بزانین کەسزادان لەبەشی پەروەردەدا هەنگاوی یەکەمو نزیکترین رێگەو باشترین چارەسەر نیە، بەڵکو پاش بانگ کردنو ئامۆژگاریو رەددی خراپەکانی بەچاکەو ئارام گرتن لەسەر ئەو کەدەیڵێت، وەکو عەرەب دەڵێن: (واخر الدواء الكلي)..

ئه م سزادانه ده بێت به هه نگاو و کاربه جێ یی (حکمة)و دانایی بێت.. هه روه کو پێغه مبه ری پێشه وامان له سه ر زوبانی قورئانی پیرۆزه وه جارێك هه ڕه شه مان لێ ده کات به وه ی که خوامان لێ رازی نی یه ئه گه ر دڵه کانمان بۆ خوا مل که چ نه بێت.. وه کو ده فه رموێت: *[ألم يان للذين امنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله وما نزل من الحق ولايكونوا كالذين اوتوا الكتاب من قبل فطال عليهم الامد فقست قلوبهم وكثير منهم فاسقون]*.

جارێك به غه ضه ب و خه شمی خوا هه ڕه شه مان لێ ده کات، وه کو له رووداوی (بوختانه که ی دایکی ئیمانداران: عائشه)دا ده فه رموێت: *[ولولا فضل الله عليكم في الدنيا والاخرة لمسكم فيما افضتم فيه عذاب عظيم]* نور.. وه جارێکیش هه ڕه شه ده کات له سوو خۆران به وه ی که شه ڕ له گه ڵ خوادا ده که ن وه شه ڕ له گه ڵ پێغه مبه ری خوادا ده که ن، وه کو ده فه رموێ: *[ياايها الذين امنوا اتقوا الله وذروا مابقي من الربا ان كنتم مؤمنين فان لم تفعلوا فاذنو بحرب من الله ورسوله]*.. وه جارێك هه ڕه شه ده کات له پشت هه ڵکه ران و به سزای دنیاو دواڕۆژ ده یان ترسێنێ، وه کو ده فه رموێت *[وان يتولوا يعذبهم الله عذابا اليما في الدنيا والاخرة]* وه له شوێنێکی تردا ده فه رموێت: *[انما يريد الله ليعذبهم بها في الحياة الدنيا]*.

وه یان سزای کوشتن و هه ڵواسین و ده ربه ده ر کردن و به ردباران کردن و داری حه د لێدان و ده ست برین و زیندانی کردن که له قورئانی پیرۆزدا هاتوون بۆ ئه و که سانه ی که پیاو کوژو ڕێگرو زیناکه رو بوختانکه رو شه راب خۆرو دزن.. که ئه مانه و ده یان فه رمانی سزادانی تر له ئیسلامدا بۆ ئه وانه ن که له په روه رده کردندا به ئامۆژگاری و چاولێکردن و دادپه روه ری و سۆزی ئیسلام په ند وه رناگرن و په روه رده نابن.. وه یاسای سزادانیش بۆ په روه رده ی کۆمه ڵ ته نها له ئیسلامدا نی یه، به ڵکو له سه ر تاسه ری دنیادا له یاسای هه موو ده وڵه تێکدا ئه م جۆره سزادانه هه یه بۆ سه رپێچی که ران.

* * *

بەشی سێهەم

# لەسەر چی پەروەردە بکەین؟

جەهەری ئەم باسە لەسێ خاڵدا کۆدەبێتەوەو ئەم سێ خاڵە بەکرۆکی باسەکە دادەنرێت:

**یەکەم: چۆن ئیسلام بناسێنینەوە بەرۆڵەکانی و پاشان بەهەموان؟**

**دووەم: لەروانگەی بیرو قەڵەمی کام زاناوە لەکتاب و سنةو مێژووی ئیسلام شارەزا بین؟**

**سێهەم: بەرهەمی پەروەردە.**

**خاڵی یەکەم:**

## چۆن ئیسلام بناسێنینەوە بەرۆڵەکانیو باشان بەهەموان؟

دەبێ ئەوە بزانین کەهەدەفو ئامانجی ئێمە لەپەروەردەکردنی تاكو کۆمەڵدا گێرانەوەی کۆمەڵە لەرێگەی خوارو هەڵدێرەکانی (**نەفامی و بێ باوەڕیو عەلمانیەت**)ەوە بۆ سەر راستە شەقامی باوەڕو خواپەرستیو ئیسلامی پڕ مافو دادپەروەری.

بەڵێ هێنانەوەیان بۆ سەر رێبازی ئیسلام.. بەچاورۆشنیو شارەزاییو ئاگاداری تەواو لەبۆچوونو ئامانجو ئاواتەکانی ئیسلام، وەکو پەروەردگار بەپێغەمبەری پێشەوامان دەفەرموێت.

ئابەم جۆرە ئیسلامیان پێ بناسێنەوەو بانگیان بکە بۆ لای: ***[قل هذه سبيلي ادعو الى الله على بصيرة انا ومن اتبعني وسبحان الله وما انا من المشركين]*** واتە: بڵێ ئەمە رێبازی منەو هەموو لایەك بانگ دەکەم بۆ لای خوا لەسەر بەرچاو روونیو بەئاگایی لەرێبازەکەم منو ئەوانەی کەشوێنم کەوتوون وەپاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگار وەمن لەهاوەڵدانەران نیم بۆ خوا.

تاگەل و کومەڵ بەرەو ئایینەکەی خۆیان کەئیسلامە نەگەڕێنەوە، ئەوا لەو ژێر دەستەیی و دەربەدەریی یە رزگاریان نابێت.. هەروەکو حەزرەت دەفەرموێت: ﴿واذا تبايعتم بالعينة واخذتم اذناب البقر، ورضيتم بالزرع، وتركتم الجهاد، سلط الله عليكم ذلا، لاينزعه عنكم حتى ترجعوا الى دينكم﴾ اخرجه ابو داود والبيهقي واحمد عن ابن عمر ووضع الالباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة.

واتە: هەرکات لەکڕین و فرۆشتنندا قەرزتان دەدا بەقەرز، وەدەستان گرت بەکلکی مانگاوە و رازی بوون بەکشتووکاڵ، هەر بەژیانی دنیاوە خەریک بوون، وەوازتان لە جیهاد هێنا، ئەوا خوا دووچاری زەلیلی یەکتان دەکات کەلێی رزگار نابن تانەگەڕێنەوە بۆ لای دینەکەتان.

جاهەر وەکو لەبەشی یەکەم دا باسمان کرد.. دەبێ ئیسلام بەو جۆرەی کەهاتووە و دەیەوێ ببێت و چی لەئادەمیزاد دەوێت و چی یان بۆ دەکات بناسێنن بەکۆمەڵ.. وەئیسلام لەچوار دیوارێکی تەسکی وەکو پەروەردەو تەزکیەی نەفس و هەندێ عیبادەت لەگۆشەی مزگەوتێک دا، وەیان هەندێ مەسائلی موعامەلات و نکاح و تەلاق گیر نەدەن.. وەلەو قاڵبە بیهێننە دەرەوەو بڵێن هەموو ئەمانە بەشێکن لەئیسلام و پەل و پۆی درەختی ئیسلامن.. بەڵام ئیسلام هەر ئەمانە نیەو تەنانەت لەمەذهەبێک و دوو مەذهەب و چەندین مەذهەب، وەکتێبێک و دوو کتێب و دەیان کتێب، وەمێشک و بیری زانایەک و دەیان و هەزاران زانا جێی نابێتەوەو هیچ کات و شوێنێکی دیاریکراویش بەتەواوەتی ناتوانێت ئیسلام لەخۆیدا جێ بکاتەوەو حەصری بکات.

وەدەبێت رۆڵەکان لەسەر ئەوە پەروەردە بکەین و وائیسلامیان پێ بناسێنین کەئیسلام ئاینێکی شمولی و هەمەلایەنەیە.. واتە ئیسلام دین و دەوڵەتە، سیاسەت و عیبادەتە، تەقواو غەزایە، حکومەت و حاکمیەتە، ڕێبازی ژینە، وەلەهیچ بوارێکی کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابوری و سەربازی و ئازادی و رزگاری دا کەم و کوڕی و ناتەواوی تێدا نی یە.. وەموسڵمانان بۆ هیچ کام لەمانە ئاتاجی بەهیچ بەرنامەیەکی تر نی یەو نابێت.

کاتێ کەتێمان گەیاندن لەوەی کەئیسلام ڕێبازی ژین و دینەو ژیانی پڕ لەکامەرانی هەمیشەیی و بەهەشتی هەتا هەتایی هەردوو دنیا بۆ شوێن کەوتوانی دابین دەکات...وەهەموو گەلانی جۆراو جۆر دەکات بەبرای یەکترو

وەدەیان کات بەملکەچی بەدیهێنەرەکەی خۆیان... وەسنورە نێو دەوڵەتی یەکان رادەماڵێ و سنوورە دەستکردەکان دەشکێنن... وەدەبێ لەوەشیان حاڵیی بکەین کەنابێ بەیاسای دەستکردی ئادەمیزادو رێبازی عەلمانیەت رازی بین... وەهەر بەرنامەیەك بێجگە لەئیسلام، لەژێر هەر ناونیشانێکدا بێت و هەر بەرگێکی کرابێ بەبەردا وەکو: **سوسیالیستی، دیموکراتی، سوسیال - دیموکرات، شیوعیەت، ئیشتراکیەت، بەعثیەت، سەرمایەداری،...** ئەمانەو چەندین کوێرە رێی تر بەتاڵن و دژ بەیاساکانی پیرۆزی ئیسلامن... سەرەرای ئەوەش کەناگونجێن لەگەڵ سرووشتی بەشەریداو نابێت پەیرەویان لێوە بکەین.

بێگومان گەلی کوردی ئێمەش کوژراوو ماڵ وێرانی دەستی ئەم یاساو بەرنامە چەوت و لارانە بووە بەدرێژایی مێژوو..

وەپێویستە لێرەدا ئەوەش بزانین کە: نابێ بەسەروەری و برا گەورەیی و فەرمانرەوایی هیچ کەسێکی شوێن کەوتووی ئەم بیردۆزانە رازی بین، چونکە ***«ولن یجعل الله للکافرین علی المسلمین سبیلا»***.

پەروەردگاری مەزن رازی نابێت لەدوسوڵمانان و رێ نادات کەمرۆڤی بێ باوەرو داوێن پیس و دوور لەخوا بکەنە گەورەو خۆشەویست و جێگەی رازونیازی خۆیان جگە لەموسوڵمانان.. وەدەبێ تەنها وەلاءو دۆستایەتی بۆ موسوڵمانان بێ و،بەرانەتیان لەبێ باوەران بێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ***«یاأیها الذین امنوا لاتتخذوا اباءکم واخوانکم أولیاء أن استحبوا الکفر علی الأیمان.. ومن یتولهم منکم فاولئک هم الظالمون»***.

کەواتە دەبێ هەوڵی ریشەکێش کردن و رەواندنەوەی سێبەری رەش و شوومی ئەم رێبازە پیس و ماڵ وێران کەرانە بدەین، کەبەسەر سەری موسوڵمانانەوەن... بەتایبەتی بەسەر گەلی ستەم دیدەی کوردەوە.. وەچی تر نەهێڵین کەخۆفرۆشان و بەکرێ گیراوان و بێ باوەران رۆڵەی گەلەکەمان هەڵخەڵەتێنن و بیانکەن بەقوربانی ئاواتە گڵاو و کورسی یەلەرزۆکەکانی خۆیان.. وەبەخوێنی ئەوان لەوە زیاتر گیرفان پر نەکەن و شەریکات لەوڵاتە ئەوروپی یەکان بنیاد نەنێن... وەهەموو بەیەك دەنگ و بەیەك ریز بەرەو مەیدانی جیهاد بگەرێینەوە بەپشتیوانی پەروەردگاری مەزن.

## خاڵی دووهەم

## لەروانگەی بیرو قەڵەمی کام زاناوە لەکتابو سوننەو مێژووی ئیسلام شارەزا بین؟

١- لەبواری عەقیدەو بیروباوەڕی راستو درووستو بێ هیچ جۆرە (**تشبیه و تعطیل و تمثیل**)ێك، وەبەو جۆرەی کەخوا خۆی ئەیەوێت وەها بناسرێتو بپەرسترێت.. باشترین رێگە بۆ ئەم باوەڕە راستو بێ خەوشە رچەو رێبازی سەلەفی صالحە کەئەویش ئەوەیەپێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵەکانی لەسەری بوونو لێی تێگەیشتوونو پەیڕەوی یان لێوە کردووە... چونکە باوەڕی خوایی و قورئانی پیرۆز لەسەر ئەوانو بەزمانی ئەوانو بەپێی رووداوەکانی سەردەمی ئەوان هاتوونەتە خوارەوە... کەواتە ئەوان لەهەموو کەس باشتر لەو باوەڕە تێگەیشتوونو دەقیان پێوە گرتووەو لەسەری پەروەردە بوون.

کەواتە ئێمە هەر کات بۆچوونی صەحابەیەکی حەزرەت دەربارەی زاتی خواو صیفاتی خوا لەگەڵ بۆچوونی زانایەکی تابعین دا لێك گیران، ئەوا لایەنی بۆچوونی صەحابەکە دەگرینو بە(**أرجح**)ئەرجەحتری دەزانین، چونکە ئەو صەحابی یە لە (**خير القرون = چاکترین سەردەم**) دا ژیاوە.. هەر چەند ئەو هاوەڵانەیش رادەی تێگەیشتنیان لەناوخۆیاندا جیاواز بووە. هەندێکیان لەهەندێکی تریان شارەزاو زاناتر بوون.... بۆ نموونە کەئەمانە لەباقی ئەصحاب (رضي الله عنهم) شارەزاتر بوون:- (**علي، أبوبكر، عمر، عثمان، زيد، معاذ، عبداللەی کوڕی عباس، عبداللەی کوڕی عمر، عبداللەی کوڕی مسعود، عبداللەی کوڕی عمرو ی کوڕی عاص، أبي کوڕی كعب**).. (وەحەزرەتی عەلی لەرتبەی چوارەم بووە نەك لەهەموو روتبەیەکدا، بەڵکو لەپلەی زانیاریدا لەدوای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) (**أعلم الناس بووە**)).

٢- لەبواری زانینی ئەحکامو دەستوورەکانی قورئانو زانینی شێوازی پەروەردەی قورئانی پیرۆزدا، هەرچەندە قورئانی پیرۆز بەدەیان

تەفسیری لێ کراوەو بەزیاتر لە (٣٧) سیو حەوت زمان تەرجەمە کراوە.. لەگەڵ ئەوەشدا بەر هەموو تەفسیرو تەرجەمەوە نەیانتوانیوە تەواوی نهێنیو رازو شاردراوەو گەوهەرەکانی دەریای بێ پایانی قورئان ئاشکرا بکەن.. وە هەندێ لەو تەفسیرانە لەسەر کۆزەرەو خەوشو خاڵیش پارێزراونین.

کەواتە بۆ زانینی واتاو ئەحکامو دەستوورو فەرمانەکانی قورئان: تەفسیری (ابن عباس، ابن کثیر، قرطبي، طەبەری) باشترین تەفسیرن.. وەبۆ شارەزایی لەروحو انقلابو شۆڕشی قورئان وەکو بزوتنەوەیەك بۆ گۆڕانی هەموو کۆمەڵگاو باری ژیانی هەر گەلێك: تەفسیری (في ظلال القران- سید قطب) چاکترینو بەرزترین تەفسیرە.. کەپێم وایە لەو بوارەدا هاوتای نی یە.

٣- لەبواری سیرەو مێژووی ئیسلامدا، ئەمانەی خوارەوە باشترین سەرچاوەیەکن کەرووی پاكو بێگەردی سیرەتی حەزرەت (ﷺ) و هاوەڵەکانیمان پێ بناسێنێت، وەکو: سیرەی (ابن هشام، ابن کثیر، ابن الاثیر، ابن خلدون، طبري، محمدي خضري بگ، جلال الدین سیوطي، ـژیانی پێغەمبەری مەزن ـی مامۆستا عبدالعزیز پارەزانی).

* * *

## لەبورای زانینی شەریعەتی ئیسلام و پەیڕەوی مەذاهبدا پێویستە چەند شتێك بزانین..

## خوێنەری بەڕێز:

**بۆ ئەوەی زیاتر بچینە ناو دەریای قوڵ و بێ پایانی ئیسلامی پیرۆزەوە سەرنجی ئەم خاڵانەی خوارەوە بدەین:-**

**یەکەم:** دەبێ رۆڵەکانی ئیسلام لەسەر ئەوە پەروەردە بکەین کەهیچ تەعەصوبێکی مەذهەبی یان نەبێت.. وەمەذهەبێك بەحەق نەزانن و باقی مەذهەبەکانی تر بەناحەق بزانین.. چونکە یەکێك لەو هۆیانەی کەبوونەتە هۆی پەرتەوازەیی و دووبەرەکی ی موسڵمانان تەعەصوبی مەذهەبی بووە.

**دووهەم:** هەرچەندە مەذهەب هەر ئەو چوارە نی یەو مەذاهب زۆرن بەڵام ئەو چوار مەذهەبە لەباقی مەذهەبەکانی تر فراوانترو باشتر ئەحکامی ئیسلامیان روون کردۆتەوەو شوێنکەوتووشیان زۆرترە.. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ وابزانین کەئەو چوار مەذهەبە هەموو ئیسلامیان لەخۆیاندا جێ کردۆتەوەو ئیسلام هەر ئەوەیە کەئەو مەذهەبانە فەرموویانە.. بەڵکو ئاینی پیرۆزی ئیسلام و دەستوورو ئەحکام و نهێنی یەکانی قورئان لەو مەذهەبانە زۆر گەورەترو فراوانترە.. وەهیچ کات لەچەغزی مەذاهبدا جێ ی نابێتەوە.

بۆیە باوەڕمان وەهایە کەدەرگای (**اجتهاد**) دانەخراوەو هەر کەسێ ئیدیعای ئەوە بکات کەدەرگای (**اجتهاد**) بەستراوە ئەوە زۆر بەهەڵەدا چووەو هێشتا لەئەبجەدیاتی ئیسلام تێ نەگەیشتووە.. وەکەسیش لەزانا پێشووەکان ئەم ئیددیعایەیان نەکردووە، هەرچەند لەدوای قەرنی چوارەم زۆر بەداخەوە ئەم ئیددیعایە هاتە ناوەوە.

**سێهەم:** تەقلید کەبریتی یە لە (**الاخذ بقول الغير دون دليل**) دوای قسەی خەڵك کەوتنە بەبێ دەلیل و بەڵگە.. وەپێویستە ئەوە بزانین کەتەقلیدکردن لەعەقیدەو باوەڕدا گومڕایی یەو بەهیچ جۆرێ دروست نی یە..

هەروەها لە (فقەو شەرع)یشدا دروست نی یەو بەتاڵە بەبێ بەڵگە، وەکو ئیمامەکان دەفەرموون.

ئیمامی أبو حنیفة دەفەرموێت: (لایحل لاحد ان یأخذ بقولنا مالم یعلم من این اخذناه).

ئیمامی مالك دەفەرموێت: (إنما انا بشر، اخطيء وأصيب، فأنظروا في رأي فكل ماوافق الكتاب والسنة فخذوه، وكل مالم يوافق الكتاب والسنة فاتركوه).

ئیمامی شافعی دەفەرموێت: (كل ماقلت وكان عن النبي خلاف قولي مما يصح فحديث النبي أولى، ولاتقلدوني).

ئیمامی أحمد دەفەرموێت: (لاتقلد دينك أحدا من هؤلاء ماجاء عن النبي واصحابه فخذ به ثم التابعين ـ بعد ـ الرجل فيه مخير).

**چوارەم:** کەواتە دەبێ ئەوەندە هەوڵ بدەین بۆ شارەزایی لەدینەکەمان کەهەر مەسئەلەیەکی عبادیمان لەهەر مەذهەبێکەوە وەرگرت، بگەڕێن بەشوێن دەلیلەکەیدا.. وەتواناى (ترجيح دانی) هەر دەلیلێك بەسەر دەلیلێکی ترمان هەبێت، تاپەیڕەوی (رواية) بین نەك (رائي).

بالەتەقلیدێك کەهیچ زانایەکی ئیسلامی ئیدیعای نەکردووە خۆ دەرباز بکەین.. وەئەمەش مانای (لامذهبية) نی یە وەکو هەندێ کەس وادەزانن.. چونکە ئەو کاتە مەذهەبی ئێمە دەبێتە (کتاب و سنة) وەتەقواو خواپەرستی یەکەمان بەپێ ی کتاب و سنة دەبێت.. وەئەگەر شتێکیشمان نەزانی ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت: *[فأسئلوا أهل الذكر ان كنتم لاتعلمون]*، واتە: پرسیار لە ئەهلی ذیکر بکەن لەو مەسەلەیەدا تابزانن ئایا ذیکر کەقورئان و سوننەیە چی دەفەرموێ نەك ئەهلەکە، کەهەندێ واحاڵی بوون کەئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ تەقلید کردن... کەئەگەر بەووردی لەمانای ئەم ئایەتەو تەفسیری ئەم ئایەتە بکۆڵینەوە، تێ دەگەین کەباشترین بەڵگەیە بۆ تەقلید نەکردن نەك بۆ تەقلید کردن... هەروەها (محمد علي شوكاني) لەسەر ئەم ئایەتە نامیلکەیەکی داناوەو رەددی ئەوانەی داوەتەوە کەتەقلیدیان بەلاوە پێویستە.

**پێنجەم**:- ئەمڕۆ بەشێوەیەکی سادەو ئاسان، بەزوبانی شیرین پاراوی کوردی بمانەوێ ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەهەموو بوارەکانی عەقیدەو تەفسیرو جیهادو سیرەت و ڕۆحی قورئان شارەزاو ئاشنا بکەین ئەوا نووسراوەکانی برای بەڕێزمان مامۆستا (علي باپیر) باشترین سەرچاوەن بۆ ئەم زانیاری یانە.. چونکە نووسراوەکانی مامۆستای بەڕێز دووره لەهەموو جۆرە دەمارگیری و تەعەصوبێکی حیزبی و مەذهەبی.. کەمیوادارین کەڵکیان لێ وەرگیرێت.

**خاڵی سێهەم**:

## بەرهەمی پەروەردە

هەر چەندە پەروەردە ئاتاج و بەرهەمی زۆرو فراوانە، بەڵام لەچەند خاڵێکدا چەند بەرهەمێکی بەسوود بەیان دەکەین:-

أ- ئەنجامدانی ئەرکی سەرشان و هەستان بەتکالیف.

ب- ڕەزامەندی ی خواو پێغەمبەری خواو موسوڵمانان.

ج- دامەزراندنی حاکمیەتی خوا لەدڵاندا و لەوڵاتماندا!.

د- ئیصلاحی کۆمەڵگەو دەربازبونیان لەفەسادی ئەخلاقی.

هـ- ڕزگارکردنی گەل و وڵات لەکۆیلەیی و داگیر کردن.

و- بەدی هێنانی کۆمەڵگایەکی ڕەوشت پاك و دەست پاك و داوێن پاك.

ز- ڕیشەکێش کردنی ستەم و نەفامی و پەراگەندەیی و دووبەرەکی.

ح- هاتنی بەرەکاتی ئاسمان و زەوی وەکو پەروەردگار دەفەرموێت: *[ولو أن أهل القرى امنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض]*.

ط- شادبوونی گەل و کۆمەڵ بەبەختەوەری هەمیشەیی.

ي- گەڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی دووبارە بۆ ناو کۆمەڵ.

* * *

## لەکۆتایی دا

لەکۆتایی دا داوا لە پەروەردگار دەکەم کەئەم نامیلکەیەم بەبەشێ لەکاری چاکە، وەلەبەر رەزامەندی خۆی وەرگرێ، هەر چەند ئەمە تەنها تنۆکێکە لەدەریای پەروەردەی ئیسلامیدا، بەلآم بەوە دلخۆشم کەبەشێکە لەو دەریایە.

*واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين*

خورمال

١٩٩٥/١٢/١٠ ز

١٤١٦/٧/١٧ ك

محمد پێنجوێنی

نامەراز بە: محمدی رازی

